

هۆنراوه

# نیشتمانم
# دارستانی
# دەم روبار بوو

مارف عومەر گوڵ

٢٠١٦

هۆنراوە

# نیشتمانم

## دارستانی دەم ڕووبار بوو

تابلۆی بەرگ و مۆتیڤی هۆنراوەکان
دەستکردی هونەرمەند «ڕێبوار سەعید»ن

ناوی کتێب: نیشتمانم دارستانی دەم روبار بوو
نووسینی: مارف عومەر گوڵ
بابەت: هۆنراوە
مۆتیڤ: هونەرمەند رێبوار سەعید
دیزاین: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی کارۆ - سلێمانی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم - ٢٠١٦
شوێنی چاپ: سلێمانی - کوردستان
نرخ: ٢٥٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٣٥٥ ) ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە

## شیعر و شوناس لای مارف عومەر گوڵ

عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی

دکتۆر مارف عومەر گوڵم وەك ئەدیب ، ساڵانی حەفتا ناسی، بە تایبەتی لە ڕێگەی ئەو بەرهەمانەیەوە کە بۆ ڕۆژنامە ئەینووسین.

بە کارێکی جوان و بەنرخم زانی کە چاوپێکەوتنێکی ناوازەی لەگەڵ مامۆستای چیرۆکنووس لەتیف حامیدا سازدا، ڕەنگە لەتیف حامید لە ژیانیدا هەر تەنها ئەو چاوپێکەوتنەیشی لەتەکدا سازدرا بێت، بۆیە ئەبێت بە خاڵێکی جوانی ژیانی ڕۆژنامەوانیی مارف عومەر گوڵ، دواجار لە ڕێگای گۆڤاری نێرگزەوە، کە لە کەرکوك لەگەڵ چەند ئەدیبێکدا دەریانکرد، پاشانیش لە شاخ چوار ژمارەی گۆڤارێکی بە ناوی (قەندیل) ەوە دەرکرد، پەرەی بە توانای ڕۆژنامەوانیی خۆی دا.

لایەنێکی زەوقی جوانی لەم بوارەدا لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەو بە قەبارەیەکی بچووك ئەو گۆڤارەی دەردەکرد کە تەواو لەگەڵ ژیانی

پێشمەرگایەتی نێو شۆڕشدا ئەگونجا و ئەبێتە یەکەم گۆڤار لە مێژوی ڕۆژنامەوانی کوردیدا کە بەو قەبارەیە دەرکرابێت. ئەگەر پێشمەرگەیەك یا هاوولاتیەك ئارەزووی خوێندنەوەی هەبوایە، ئەیتوانی بە ئاسانی ئەو جۆرە گۆڤار و نامیلکە قەبارە بچووکانە هەڵبگرێت و گونداو گوندیان پێبکات، تەواو وەك ئەزموونی کتێبی گیرفان.

شیعری مارف عومەر گوڵ داکۆکیکردنە لە چەمکی شوناس، ئەو هەر لە سەرەتایەوە ئەم ڕێچکەیەی گرتووە، بۆ نموونە لە بەرهەمی یەکەم کۆمەڵە شیعریەوە کە ساڵی ١٩٨٥ لە بەغداد چاپکرا و من بە زمانی عەرەبی لە گۆڤارێکی ئەدەبیدا شتێکم لەبارەیەوە نووسی.

بۆ قسەکردن لەسەر شیعرەکانی، بە باشی ئەزانم پەنا بۆ زاراوەی ئاستانە (عتبە) ببەم، کە ڕۆڵێکی دیاری لە خوێندنەوەی ڕەخنەییدا هەیە، ئەبێت بە دەروازەیەك لەو دەروازانەی کە نووسەر ڕۆژێك ئاشکرایدەکات و دەیدرکێنێت و ڕەخنەگریش دەیکات بە بۆنەیەك بۆ خوێندنەوەی ڕەخنەیی.

گرنگیی ئاستانە لە گرنگیی دەق و یەکە سەرەتاییەکانی کەمتر نییە، بە تایبەتی لە لێکۆڵینەوەی نوێدا. ئێمە دوو جۆر ئاستانەمان هەیە، ئاستانەی ناوەکی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە دەقەوە هەیە، وەك نووسینی سەر بەرگ، ناونیشان، پێشکەشکردن، پێشەکی، .....هتد. ئاستانەی دەرەکی، واتە ئەو شتانەی کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لە دەرەوەی دەقدا پەیوەندییان بە دەقەوە هەیە، وەك چاوپێکەوتن، یاداشت،

بێوگرافی، یا هەرشتێك لە دوورەوە بمانباتە سەر پێکهاتە و جیهانی ناوەوەی کارەکە.

لە کۆمەڵە شیعری (شاییەکی نهێنی)دا کە ساڵی ٢٠١٥ چاپیکردووە و کۆمەڵێك شیعری هەشتاکانی خۆی، لە خۆگرتووە، پێشەکییەکی بۆ کتێبەکەی نووسیوە، وەك ئۆتۆبایۆگرافییەك وایە، تێیدا هەم ژیان و هەم ئەزموونی شیعری خۆی ئەخاتە ڕوو.

لەوێدا ئاستانەیەك هەیە دەکرێت ببێت بە دەروازەیەك بۆ چوونە ناو شیعرەکانییەوە. ئەو لەوێدا بەم شێوە قۆناغبەندیی بۆ شیعرەکانی خۆی کردووە:

- قۆناغی یەکەم : دیوانی (هێلانەی نوغرۆ) ١٩٨٥،

- قۆناغی دووەم : دیوانی (خۆری زیندان) کە دووجار لەناو شۆڕشدا، ساڵانی ١٩٨٥، ١٩٨٧ چاپکراوە،

- قۆناغی سێیەم : دیوانی (شاییەکی نهێنی) یە کە ساڵی ٢٠١٥ چاپکراوە,

- قۆناغی چوارەم : واتە ئەو شیعرانەی کە سەرجەمیان لە دەرەوەی وڵات، ساڵانی ١٩٨٨-١٩٩٩ نووسراون, مەبەستمان لێی ئەم کۆمەڵە شیعرەیە ,

- قۆناغی پێنجەم، ئەوشیعرانەی لە خۆگرتووە کە لە (٢٠٠٠) بە دواوە لە گەڕانەوەیدا بۆ نیشتمان نووسراون.

ئەم گەواهینامەیەی شاعیر خۆی بەرچاوڕوونییەك بۆ خوێنەر و ڕەخنەگر

دەڕەخسێنێت.

سەرچاوەی پێکهێنەر لە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەدا، واقیعی ناوەکی و دیدی مارفی بۆ جیهان و دەوروبەری دیاریکردووە.

لە (هێلانەی نوغرۆ)دا ، واتە لە قۆناغی یەکەمدا، سەرەتا و ڕوخسارو تیمە و جیهانبینی و کەرەستەی ئەومان بۆ دەردەکەون:

١- منێکی غینائی، بەڵام تەنها هەر لەیەك بازنەی زاتیدا نەسوڕاوەتەوە. لەوێدا منێك هەیە، هەر لە کەفوکوڵی ناوەوە و ناخی تایبەتی ئەم ( وەك شاعیر )، نادوێت، بەڵکو ئەبێت بە منێکی کۆمەڵایەتی، لە کۆمەڵێك ، لە نیشتمانێك، لە جیهانێکی گەورە ئەدوێت.

٢- هەڵبژرادنی گوتاری مانەوەو داکۆکیکردن لە چەمکی شوناس و لکان بە هەموو شتێکەوە کە بەرەو ڕابردوو و کەلەپوری شوناسی ئەباتەوە.

٣- دیدێکی گەشبینانە، لەمەدا مارف عومەر گوڵ لەو دەنگە کەمانەی هاونەوەی خۆیەتی کە زۆر گەشبینانە لە شوناس و دەوربەری خۆی دەڕوانێ.

٤- هەڵبژاردنی شێوازی شیعری نوێی کێشدار، کە تا ئەمڕۆیش بە یەکجاری وازی لێ نەهێناوە ، جگە لە هەندێك شیعری نەبن کە تێیاندا دەسبەرداری کێش بووە، بە پێچەوانەی شاعیرانی نەوەکەیەوە کە هەموویان ڕوویان لە شیعری بێکێش کردووە.

٥- پەنابردنەبەر کەلەپوری کوردی و سوودبینین لە کۆدەنگ و فرەدەنگی وەك لە ئۆپەرێتی (شاروخ و گوڵڕوخ) دا دەرکەوتووە و لە دیوانی

(هیلانەی نوغرۆ )دا بڵاوبووەتەوە.

ئەم شێوازو خەسڵەت و جیهانبینییانەی (هێلانەی نوغرۆ) دەسەڵاتی خۆیان گەیاندووەتە پانتایی دەقی کۆمەڵە شیعرەکانی تری (خۆری زیندان ، شاییەکی نهێنی ، سەرجەم شیعرەکانی دی کە وەك دیوان چاپنەکراون).

ئەم کۆمەڵە شیعرەی ئێستایشی کە شیعرەکانی تاراوگەی لە خۆگرتووە ، هەمان شێوازو خەسڵەتی، بەجۆرێکی دی تێدا دەبینرێن، تەنها ئەوەیە کە زەمەن و شوێنی نووسین جیایاندەکەنەوە، واتە سەردەمی ئاوارەیی و دوورە وڵاتی و ژیانی تاراوگەی، بەڵام بە ئاسانی تیمەی شوناس و هیوا و بەرگری، دژ بە سەختیی ژیان و لکان بە ڕابردووی میللەت و دەربڕین بە شێوازی کێش و پەنابردنەبەر ڕاناوی قسەکەریان پێوە دیارە. ئەو بۆ گەیاندنی سۆزێکی گەرمی هەڵچوو، بە زمان و وێنەی ڕوون و ڕاستەوخۆ ، گڕوتین و سووتانی تاراوگەی کردووە بە سەرچاوە.

سەرچاوەی سۆزی دەروون و سووتانی نێو تاراوگە بۆ زێد، بە زۆری (من) گەورە و قەبە دەکەن، بەڵام لێرەیشدا مارف لە (من) ی خۆیەوە وەك تاکێك ، ئەگۆڕێت و ئەبێت بە منێکی کۆ، شیعرەکانی لە پاڵ سووتانی خۆی لە تەنووری تاراوگەدا خەمی شوناس و کومەڵ و نیشتمان هەڵئەمژن.

من لە چەند وتارێکی ترمدا باسی شوناس و ئەنتی نیشتمانم کردووە، وتومە شیعری کوردی لە گوتاری شوناسدا بە شێوەیەکی پتەو لەسەر

نیشتمان وەستاوە تا ڕادەی ئەوەی زۆربەی شاعیرانمان لە نیشتماندا تواونەتەوە، گوتارەکەیان بەزەقی و ڕوونی بووە بە بەشێك لە گوتاری شوناس، بە دڵنیاییەوە لێیان ڕوانیوە، بۆشایی نەکەوتووەتە بەینیانەوە. گوتاری شیعری مارفیش لەسەر ئەم ڕیتمەیە، مارف شیعری ئەنتی نیشتمانی نەنوسیوە، هەمیشە لەگەڵ نیشتماندا تەبا بووە، لە دوورییشدا تێیدا تواوەتەوە، تەواو بەپێچەوانەی شاعیرێکی وەك محەمەد ماغووتەوە، کەلە دێڕێکیدا ئەڵێت خۆزگە نیشتمان وەك سەماکەری نێو مەلها دەساودەسی دەکرد و ئەگۆڕایەوە.

نیشتیمان وەك بەشێك یا زاراوەیەکی نێو شوناس ئەمسەر و ئەوسەری شیعری د. مارفی داگیرکردووە، ئەو لە هەموویاندا لە یەك ژێ ئەدات، بەڵام بە ئەنجامێکی جۆراوجۆرەوە ، بۆ نموونە ناوکەکە لە کۆمەڵە شیعری یەکەمیدا بە ڕەنگوبۆیەکی جوانەوە دەرئەکەوێت، لە دیوانی (خۆری زیندان)دا هەمان لێدانی ئەو ژێیەیە، بەڵام ئەمجارەیان جەخت ناکاتە سەر نیشتمان وەك وێنەو شوێنی کراوە، بەڵکو ئەمانباتە نێو شوێنێکی داخراوەوە، نێو تاریکی زیندان و ژووری داخراو و ژێرزەمینی قووڵ، واتە بە بەشێکی تری نیشتیمانمان ئاشنادەکات کە داخراو و تاریك و ترسناکە. هەواڵەی کۆمەڵێك دەلالەتی جۆراوجۆرمان دەکات .

شاعیر لە کۆمەڵە شیعری (شاییەکی نهێنی) دا جارێکی تر ئەمانگێڕێتەوە بۆ فەزا و شوێنە داخراوەکانی نیشتمان، بۆ ژیانی سەختی نێو شاخ و باوەش لە سروشت دەدا، بە جۆرو ڕیتمی باوی خۆی کار لە شوناسدا

دەکاتەوە.

لەپاڵ ئەمەدا ئەتوانین بڵێین شیعرەکانی (شاییەکی نهێنی) بوون بە سەرگوزشتەی خۆی وەك جەنگاوەرێك. لەم شیعرانەی ئەم دیوانەیشدا کە لە تاراوگە نووسیونی، تاراوگە وەك شوێن ئەبێت بە دوو شوێنی جیاواز، یەکەمیان تاراوگە، دوومیشیان زێدی خۆی، هەوارگەی منداڵی. لەم دەقانەدا زیاتر لەجاران کار لە یادگە (زاکرە) دەکات، یادگە حوکمی خەیاڵ دەکات و سنووری تایبەتی بۆ دائەنێت:

هەر خەونی هاوینەم،
ئازادی دەم جۆگەو بێستان بوو
هەر خەونی پایزەم
ڕوانینی درەختی زەرکەفت و تێڕامان لە گەڵاڕێزان بوو
هەر خەونی زستانەم،
گەڕانی ناو قوڕ و چڵپاو و
خۆدانە بەر ڕێژنەی باران بوو
هەر خەونی بەهارەم،
سەیرانی گوڵاڵەچنین و عەسرانی ناوڕان بوو.

دڵنیام لەوەی کە دکتۆر مارف لەم جیهانە جەنجاڵ و شێواو و لێکترازاوەدا سنووری قۆناغەکانی پێشووی جێدێڵێت و ئەچێتە قۆناغێکی ترەوە، ژیانی وانەوتنەوە و توێژینەوەو زانکۆ قورسایی ناخاتە سەر ڕەوتی شیعریی.

هیوادارم بەگوڕوتینی سەردەمی (هێلانەی نوغرۆ) وە شیعرێك بنووسێت لە دڵەڕاوکێ و دوودڵی و پشێویی و بێئارامیی ئەم سەردەمەوە هەڵقوڵابێت. هەموو سەردەمێك گوتارو مۆرکی خۆی پێوەدیارە، ئەدەب و هونەر و شوناسی خۆی هەیە.

من دڵنیام و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەم.

سلێمانی

٢٠١٦/٢/١٦

# ماڵ لە غەریبی و ..
# دڵ لە دەروێشان

لە هەلومەرجێکی زۆر سەخت و دژواری کوردستاندا بە مەبەستی خوێندنی باڵا لە دەرەوەی وڵات، پایزی ساڵی ١٩٨٨ ئەو ولاتە وێرانکراوەم جێهێشت و گەیشتمە تاران، ئیتر لەوێوە، هەستم بەوەکرد روو لە دونیای غەریبی دەکەم و نەمدەزانی وڵات چی بەسەر دێت و بەرچاویسشم زۆر روون نەبوو چۆن دەگەمە شوێنی مەبەست، لە تاران لە گەڕەگی تۆپخانە لە مسافیرخانەیەك دابەزیم . لە مانگی تشرینی یەکەمدا گەیشتمە مۆسکۆ، گیرفانم (پڕبوو لە خاڵی)، هەرچۆنێك بوو لەوێوە بە ڕەسمی گەیشتمە(کییێڤ) ی پایتەختی کۆماری ئۆکراین .

منێکی تەواو گرێدراو بەنیشتمان و میللەتەوە، هەر وامدەزانی ئەگەر ئەو کۆڵە قورسەی ئەو خەمە هەڵنەگرم ئیتر بێ کەڵك دەبم و غەدرم کردوە و هەر بۆ مردن باشم .

لە کوردستانی دوای ئەنفال و کیمیا بارانەوە، بە خەموخەفەتێکی زۆرەوە، خوایە چۆن جارێکی تر وەکو جاران ببمەوە خوێندکار و بڕم بەسەر

خوێندنەکەمدا بشکێت ، لەپاش شەش ساڵ دابڕان لەخوێندن چونکە ساڵی ١٩٨٢ زانکۆم لەبەغداد تەواوکردبوو، بەتایبەتی دەبێت دەست بەخوێندن و فێربوونی زمانی روسی بکەم . لە گەڵ دەستپێکردنی خوێندنی زماندا، لە کەش و ئەتمۆسفیرێکی جیاواز لە رابردوو، کەوتمە بارودۆخێکی ترەوە، ئاخۆ خۆم بۆ بواری خوێندنەکەم تەرخان بکەم و ئیتر واز لە شیعر بهێنم ؟ یان لە نێوان شیعر و یاسای نێودەوڵەتاندا بێم و بچم ؟ نەمدەتوانی دەستبەرداری هیچیان بم و هەرواش مامەوە .

لە کوردستان لە نزیکەوە ئاگاداری ئەنفال و کیمیا باران و کارەساتی گەورەی میللەتەکەم بووم، بۆیە لە چەند مانگی سەرەتای خوێندنی زماندا بڕیارمدا کە تێزی ماستەرەکەم لەسەر تاوانی جینۆساید بنوسم. ئیتر لە نێوان شیعر و جینۆسایدا هەر لە کۆتایی ساڵی(١٩٨٨)ەوە، ئەمسەر و ئەوسەرم دەکرد .

لە بەر ئەوەی من خوێندنەکەم ئەدەبیات نەبوو، کارێکی قورس بوو لە نێوان ئەدەب و بابەتێکی تردا بتوانم زاڵبم بەسەر زمانێکی تازە و ئەدەبیاتی روسیدا، هەر بۆیەش زمانی پسپۆڕی خوێندنەکەم زیاتر زاڵبوو بەسەرمدا، مایەوە ئەوەی بە ئارەزووی تایبەتی خۆم جاروبار ئاورێك لە شیعری رووسی بدەمەوە .

ئۆکراین ، وڵاتێکی جوان، بەڵام زستانی زۆر سارد و بەفری زۆری هەبوو، بەشێکی زۆری زستانەکەی پلەی گەرما لە ژێر سفرەوە بوو ، ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکەکە تەواو تێکەڵی سروشتی وڵاتەکەیان ببوو، منیش

کەوتمە ئەو ژیان و سروشتەوە .

ئەم شیعرانەی ئەم دیوانە سەرجەمیان لە دەرەوەی وڵات نوسراون ،لەپایزی ساڵی (١٩٨٨) ەوە دەست پێدەکات تاکو ساڵی (٢٠٠٠) کە بە یەکجاریی گەڕامەوە بۆ کوردستان. یەکەم شیعرم لە تاران نوسیوە، هەربۆیە پێم خۆشبوو ئەم دیوانەش بەناوی ئەوشیعرەوە ناو بنێم ، (نیشتمانم دارستانی دەم رووبار بوو).

قۆناغی ئەم کۆمەڵە شیعرەم بۆ خۆم لە لایەکەوە سەخت و قورس بوو، لە لایەکی دیکەوە لە رووی بەرهەمەوە خراپ نەبوو، ئەندازەیەك خۆم بە دەوڵەمەند و سەرکەوتوو دەزانم، هەم بوومە خاوەن ئەم شیعرانەو هەم ئاستەکانی خوێندنەکەم (زمان و ماستەر و دکتۆرا) م بەباشی بڕی. ئەوەی زۆر خۆشحاڵی کردم کە لەمانگی (٥)ی ساڵی (١٩٩٠) دا گفتوگۆی ماستەرنامەکەم تەواوکرد لە سەر بابەتێکی تازە کە (جینۆساید) ی کورد بوو .

لە ژیانی رۆژانەمدا لە ئۆکراین و روسیا (ئەوروپای رۆژ هەڵات)، لە گەڵ بەلژیك (ئەوروپای رۆژ ئاوا) کە دوای تەواوکردنی خوێندنەکەم رووم لەوێکرد، ئەوەندەی توانیم لە هەردوو تێزی خوێندنەکەمدا،خواست و مەبەستی ئەو دوو کارەم بخەمەڕوو بۆ خزمەتی دۆزی نیشتمان و میللەتەکەم، بەو ئەندازەیەش ، بەڵام بە زمانی شیعر و بە دەربڕینی ئاخ و خۆزگە پەنگخواردووەکانی ناخ، ئەم شیعرانەم لەدایك بوون .

لەم شیعرانەمدا، هەندێك جار بە ئاسانی تەسلیمی داڕشتن و دەربڕین

بومە ئەویش قورسایی فشارە دەرونییەکان وایلێکردووم ، هەندێك جاریش وێنە و دیمەنە جۆراوجۆرەکان  قورستر و سەنگین تر خۆیان تەسیلم کردووە و زمانی دەربڕین تێکەڵی دەوروبەر بووە .

با لێگەڕێم ، شیعرەکان خۆیان  بۆتان  بدوێن  . .

ئیتر  (ماڵ لە غەریبی و دڵ لە دەروێشان ...) .

**م .ع . گوڵ**

**سلێمانی –  ٢٠١٦/٤/١٥**

# نیشتمانم
# دارستانی دەم روبار بوو

هێشتا سەرمای کەژ و کێوم پێوە مابوو
شەختەی غەریبیەك گرتمی
ئاخ، ئاخ چی بکەم
ئەم دوورییە،
مشتە کۆڵەی دەستی ئاڵی پەرییەکە سەر دەکوتێ
نە شێت دەبم، نە دەمکوژێ ! چی بکەم،
لە نیشتمانەکەی خۆمدا
پەنابەردێك نییە چەکمەی داگیرکەری پێوە نەبێ
سێبەری هیچ دارێك نییە نەکرابێتە کەمین لە من
چی بکەم ! نیشتمانێکی وێران و سوتاوم جێ هێشتووە
میللەتێکی رووتە و ژەهر پێدارژاوم  جێ هێشتووە

مارف عومەر گوڵ

نیشتمانم دارستانی دەم روبار بوو
روباریان لێم ژەهراویی کرد ! دارستانیش هەڵپڕوزا
چەڕە دووکەڵ تاساندومی
ئاوارەیی شوورەیەکی لە دەور بەستووم
سنوورێکی کوشندەیە !

* * *

هەرکەسێکی وێرانەدڵ بەرچاو کەوێ
ئەو وەکو من، نیشتمانی بە دەم سەگ و گورگەوەیە
هەرکەسێکی سەر نوغرۆتان بەرچاو کەوێ
ئەو وەکو من
هەزاران جار نوکە شەقی نامەردانی بەرکەوتووە
کوشتمی ! ئەم ئاوارەییە کوشتمی
دڵم ئەڵێی وڵاتە وێرانەکەی ئێستایە ،
ئەی شۆخە نائاشناکان !
دڵم نایە گڕی چاوم خۆشتر بکەم
دڵم نایە چاو لێك بنێم
جاربەجاریش تێم مەڕوانن ، با لە گڕی خۆمدا بمرم .

* * *

نیشتمانم دارستانی دەم روبار بوو
بەڵام ئێستا دوکەڵێکە ! بووە بە هەور
چی بکەم شادی ،
هەتاوێکە و تەمێکی تەڵخ لێی ون کردوم
تەنیا جارێك لێم داباری
ئیتر شەختەی غەریبی و خەم بۆخۆی دەڕوا .
ئەی پەڵە هەوری خۆشبەختیی
تەنیا جارێك بمدۆزەوە ، نەوەی ئەم زەمینە رەقەم
هەر رێژنەیەکم بەرکەوێ ،
وشکەڵانی خەفەتباریم سیمای گەش و پاراو دەبێ
ئیتر بشمرم قەیناکا !

*　　*　　*

سەرم هەراسانی کردووم ،
نیشتمانی جوان و قەشەنگ
نیشتمانی وێران کراو
دارستانی سەوز و دڵگیر،دارستانی وشك و سووتاو
دوێنێی خەڵکی دێهات نشین
ئیمڕۆی خەونی لمستان و تەلبەند کراو
بنمیچ و ژێرخانی زیندان، وەرزی پێکەنین و گریان

سەرم هەراسانی کردووم
هەموو دونیای گرتۆتە خۆی ، خۆم ناتوانم ،
داگیر کەران ، ئەم چاکەیەم لە گەڵ بکەن
ملی منیش بقرتێنن !

*　　*　　*

کچێکی چاوڕەشی تاران ، چاو هەڵدێنێ
چی بکەم جارجار،بە تیلەی چاو دەمدوێنێ
لێم گەڕێ توخوا لێم گەڕێ
ئەوا ماچێکت پێ بەخشیم
ئەوا شەوێ، دووشەو ،دە شەو،لە لام خەوتی
تۆ دەتوانی نیشتمانم بۆ ئاوەدان بکەیتەوە ؟
تۆ دەتوانی بمبەیتەوە وڵاتەکەم ؟!
خوت تووشی گۆبەندێ مەکە،با کۆمیتە قۆڵت نەگرێ
لە من گەڕێ، با هەر بە خەمی خۆمەوە
بچمەوە بۆ مسافرخانە لاتەکەم .

١٩٨٨/٩
تاران

# باوەشێ گوڵ

**بۆ ماموٚستام :**

**ئیرینا ئەناتۆلیڤنا**

دوژمن بە دەردێکی بردووم ،
زریان بە ماڵە هەژاری نەکردبێ
لە وڵاتی خۆشەویستیی ڕاوی نام و
هەڵی دامە دورگەی شێتان
لەوێشەوە، بە سەر شوورە و، بە تەلبەندی،
سنوور لە دوای سنوورەوە ، هاتمە لای تۆ ئیرینا گیان .
من زمانی تۆ نازانم
تۆ زمانی من نازانی
کە دێمە بەر تیشکی وشەی شیرینی تۆ
غەریبێکی بێ زمانم

مارف عومەر گوڵ

هەفتەی جارێك، زمانم هەر نایەتە گۆ
هەفتەی جارێك،
نە زمانم لە وشەی شیرین تێر دەبێ
نە گوێچکەم بە،
دونیای تازەی پڕ ئاوازەی ، تۆ فێر دەبێ .
گەر پێت خۆشە تەنیا جارێك لێم تێ بگەی
گەر پێت خۆشە فێری ئەلف و بێی شیرینی خۆتم بکەی
تۆ دەتوانی بمکەیتەوە هەرزەکارەکەی جاران و
هەتا مردن بە خێوم کەی !

* * *

لە لای ئێوە مناڵ ناگری ،
بە گەورەییش من دەگریەم
توخوا فێری پێکەنینی خۆتم بکە، با گریانم بیرچێتەوە
هەر زمانم بکرێتەوە، ئەوەندە بە سەرتا دەگریم
هەتا فێری گریان دەبی !
زوو فێرم کە، تا پێت دەکرێت
غەریبێکم، هەر ئەوەندەم لە باردایە
باوەشێ گوڵ بێنمە بەر پێت .

ئۆکرانیا ـ کییف
١٩٨٨/١١

## بۆ شۆخێکی نائاشنا

خۆشەویستیم بە خۆمەوە نەدیوە، هەتا سەر بێ
خەونی شەوێکی ئارامم نەدیوە ، بێ راونان و دڵەڕاوکێ
ئەی خانمی نائاشنا و شەنگ
کوردێکی ئەوەند کێویلەم ،
ئیمشەو لە سەمات رانایەم !
فێر نەبوومە هەر شەوەی میوانی باخەڵێك بم
تاوانت کرد پەنجەت لە زامی من وەردا .
وامزانی هەر لە وێرانەی خۆمدا
دڵم دەشکێ و بە سەر خۆمدا دەشکێمەوە !
یا ئەوەتا ،
ئەو دڵە هەناسەسوارەم بە خۆشەویستیت ئارامکە و
ئەو چاوی پڕ شکۆی شەرمەم ،
نیگا باران بکە و مەڕۆ ،

یا زامێکی تر لە جەرگم مەکەرەوە
بەرگەی ئەو هەموو ژانە ناگرم
نەوەك نەگەڕێمەوە نیشتمانەکەی خۆم و
کەسێ نەبێ ، شان بداتە بەر تەرمەکەم !
هۆ خانمی نا ئاشنا و شەنگ !
ئەو سیما غەمبارەی دەیبینی
نیشتمانێکی سووتاوە ، هاتۆتە لات
ئەم مرۆڤە کەم دووەی ، دەیبینی
دەوەنێکی لە خاك هەڵکێشراوە ، هاتۆتە لات
ئەو گریانە قەتیسەی دەیبینی ،
روبارێکی بەر لێ گیراوە ، مەنگ بووە .
تۆ،نە نەخشەی ئەم نیشتمانە سووتاوەت بۆ دەکێشرێ
نە دەبیتە کەژ و لە پاڵ تۆدا بڕوێمەوە
بە سەرەڕۆیەکەشتا دیارە ، ئەم گریانە ناسڕێتەوە ،
دڵم بەرگەی ئازاری تۆش ناگرێ و بڕۆ !

١٩٨٩/٣
ئۆکراینا ـ کییڤ

## قیژە

بە پاڵتۆیەکی ئەستوور و شەپقەیەکەوە ،
بن درەخت و بن درەختی،
شەقامە زستانییەکانی کییف دەگەڕام
درەختەکان سەریان نایە بن گوێمەوە :
ـ تۆ خەڵکی کوێی ، وا غەمباری ؟!
+ بڵێی قیژەی نیشتمانێکی سووتاوتان نەبیستبێ ،
وا میللەتێك بە برینی کۆن و نوێوە کرم خواردی !!
خۆم گەیاندەوە ژوورەکەم ،
جووتێ کۆتر سەریان نابوو بە یەکەوە و دەنووکیان
لە پەنجەرەی ژوورەکەم دەدا :
ـ کاکە ئەوە ، بۆ بەتەنیا دانیشتووی ؟!
چەند هەنگاوێك لەولای تۆوە کۆڕی سەما و تریقەیە !

+ بڵێی کۆترێکی لانەوازی  وڵاتەکەم ،
لە بەر شەڕ و هەرا  تەنیا جارێك رێی نەکەوتبێتە لاتان ؟!
چوومە هۆڵی سەماگەوە ، دوور دانیشتم
شەو درەنگێ ، هەر بە تەنیا گەڕامەوە ،
بەرچاوم دووکەڵ گرتبووی !
لە گیرفانەکەی سەر دڵم ، نامەیەکم هێنایە دەر :
((چەندەم  جارە ،
دوژمنی هار گوندەکەمی سوتاندەوە ؟!))
هەر بە پاڵتۆ و پۆتینەوە ،
خۆم هەڵدایە  سەر نوێنەکەم :
(( ئەوا ئێستا  بە سەر وڵاتی شیرینما  دێم و دەچم ))
گەر نیوەشەو  دەنگی دەرگاتان گوێ لێ بوو
لە شیرین خەودا، راپەڕین  .. مەشڵەژێن
ئەوە باڵدارێکی گڕگرتووە

مارف عومەر گوڵ

به سەر ئەو هەموو سنوور و شوورە و کۆسپ و
گەلەگورگ و پۆلیسەدا ، هاتۆتەوە !
بەیانی زوو ، هەرکامێکتان دەرگای حەوشەتان کردەوە
ئەگەر مشتێ خۆڵەمێشتان له بەر دەرگاکەدا بینی
توخوا نەکەن پێی پیا بنێن ، ئەوە دڵی منە
دڵەکەی من ،
مەگەر هەر ئاوا بێتەوە ، ناتوانێ .. نا !

٢ /١٩٨٩
ئۆکراینا ـ کییڤ

## شیعرێکی ناتەواو

چاوم سوور بوو ،
ئەوا ئەمشەو خەو یەخەم دەگرێ و نانووم
نازانم بۆ ، تۆ داوای شیعرت لێ کردم
خۆزگە شیعرێکم هەبوایە
وەك تۆ شۆخ و شیرین بوایە
خۆزگە شیعرێکم هەبوایە
پرچی تۆ هێلانەی بوایە !

*        *        *

تۆ نیشتمانی سووتاوی منت دیوە ؟!
تۆ شیعری پڕ گریانمت کەی ناسیوە ؟!
هەر یەکەم جار منت بینی ،
دیارە چاوم گشت تەمەنمی پێوە دیار بوو
تریفەی ئەو مانگی چاوەت ،
ئیمشەو بۆ من چراخانی شەوی شار بوو .

١٩٨٩/٢/٢٥
ئۆکراینا-کییڤ

# دوو دونیای جیاواز

**بۆ کۆرپەیەکی ٨ ـ ٩ ساڵانی ئۆکراینی**

مەڕوانە سمێڵی پیاوانەم
مەڕوانە تەمەنی شێواوی باڵاتر لە دەمی بەهاری تەمەنت
ئەوساکە، وەك تۆ بووم
نە شارم بینی بوو، نە دونیای پێشکەوتن
ئەوساکەش وەك ئێستا
ژیانم تەژی بوو لە ئێش و نەسرەوتن .
ئەوساکە وەك تۆ بووم ، ئەو ساتەم پێ خۆش بوو
بە ڕۆژ هەر بەرەڵڵا، لە خۆڵی ناو کوچە و کۆڵاندا
شەوانیش بێزار بووم
لە کۆڕی چوارمشقی ناو ماڵ و دیواندا .
ئەو ساکە وەك تۆ بووم

هەر خەونی هاوینەم ،
ئازادی دەم جۆگە و بێستان بوو
هەر خەونی پایزەم ،
روانینی درەختی زەڕکەفت و تێڕامان لە گەڵاڕێزان بوو !
هەر خەونی زستانەم ،
گەڕانی ناو قوڕ و چڵپاو و
خۆ دانە بەر ریژنەی باران بوو
هەر خەونی بەهارەم ،
سەیرانی گوڵاڵە چنین و عەسرانی ناو ڕان بوو
ئەی کۆرپەی نائاشنای جاران و
ئێستاکەی تەمەنی پڕ کۆسپم
وەك تۆ نیم ،
لە ژانی هەمیشەم راهاتووم
لە ئاخ و حەسرەتی گەلەکەم راهاتووم
جارانم لە ئێستام ناخۆشتر
ئێستاکەم ، هەر خەونی خۆشبەختیی داهاتووم !
لێم مەگرە !

مارف عومەر گوڵ

به چاوی سۆزەوە چاوانم لە چاوت ناترووکێن
پێت سەیرە ، کەسێکی نائاشنا بەو جۆرە بڕوانێ
لێم مەگرە ! من کوڕی گەلێکم لەت لەت و پەرۆشە
تا ئێستاش هەر تامی ئازادی نازانێ !
ئەی کۆرپەی باوەشی ئەم دونیای لە دونیام جیاوازە
ئەم پیاوە تەواوەی روو بە رووت وەستاوە
تا دەمرێ دەروونی پڕ گرێ و پڕ رازە .

زستانی / ١٩٨٩
کییڤ





ئەم تابلۆیە هونەرمەند «ڕێبوار سعید» تایبەت بۆ هۆنراوەی (ئەی تۆف دە وازم لێ بێنە) کێشاویەتی، لە ژمارە ١٦/ پاییزی ١٩٨٩ی گۆڤاری یەکێتی نووسەرانی کوردستاندا بڵاو کراوەتەوە.

مارف عومەر گوڵ

## ئەی تۆف ، دەوازم لێ بێنە

فرمێسك ئامێتەی بارانە،
پەنجە هاوڕێی چڵەداری بابردەڵەی دەم زستانان
قەل و داڵی ئەم دونیایە سەریان وەرداوەتە دڵم ،
ئەوا سەرم داوەڵێتی !
کۆتری سەر پەنجەرەی دڵ لە سەرمانا هەڵکورماوە
نەدێ لە خوێنی من تێر بێ
نە سەرماش وازی لێ دێنێ !
دونیا تۆفە و با لە پرچی دار ئاڵاوە
کۆست کەوتوانە بە سەر ئەژنۆی خۆیدا دەگری
دەڵێی وڵاتەکەی منە ،
وا بە دەستی دوژمنەوە دۆش داماوە !
بۆ بای گەردوون هەر دەمبات و هەر دەمهێنێ
تۆفی تووڕەی ئەم ڕۆژگارە ، ماتەمێکی ئەوەند سەیرە
نە پشتم لێ هەڵدەکات و نە وازیشم لێ دەهێنێ .

کییڤ
١٩٨٩/٢

## گەمارۆ

کانییەکی بێ کچۆڵەم
ئێوە کانیی واتان دیوە ؟
گوندێکم بێ ڕانە مەڕو ڕێژنەی باران
ئێوە گوندی واتان دیوە ؟
شارێکم بێ خۆشەویستیی دارستان و بێ چراخان
ئێوە شاری واتان دیوە؟
دەزانن کێم ؟!
وڵاتێکم ، لە چوار لاوە
گەلە گورگی دوژمنانم لێ ئاڵاوە .

١٩٨٩/٢
کییڤ

# ئەی باڵندە بمخە سەرباڵ

نەمزانی ئاوازی غەمگینی سەر پەردووی وڵاتم ،
بەمجۆرە دەمکوژێ
بێرە لام، باڵ بنێ سەر سەرم،
چەترەکەم بێژنگی بەر سەدەی تەرزەیە
بێرە لام،
باڵندەی لە شادی ڕەتێنراو، هەر جارێ بێرە لام !
سەدبریا لە یەکەم هەورازدا دەمردم
نەمدەدی قەرەقوش ببێتە سوڵتانی ئاواتم
سە د بریا لە یەکەم هەورازدا دەمردم
نەمدەدی پۆستاڵی ژەندرمە بگاتە سەر لوتکەی وڵاتم .

*　　*　　*

پشتاوپشت تەوێڵی تەکان و هەڵمەتم داوێتی لە تاوێر
پشتاوپشت بەرچاوم لێڵ بووە !
پشتاوپشت خوێناو لە چاوانم دەبارێ ،
تەختاییم لێ بووە بە هەڵدێر
تەرزە لێی داکردم، لافاویش لە دووتوێی شەپۆلیا هەڵیدام
ئێستاکە بن رەبەن وڵاتمە ! هەر لە سەر پاژنەی پێ وەستاوم
ئێستاکە هەر یادە
جۆگەلەی دەرژێتە سەردەشتی لماویی هەناوم !
بێرە لام ، چریکەم خواوەندی هێنایە خوارەوە
هەر دونیای بێکەسی و بن رەبەن گرتوومی
بێرە لام ، باڵندەی تەریوی خۆم ئاسا
ویژدانی دڕندەی سیاسەتە و گوشیومی !
ئەمجارە بمخەرە سەر باڵ و
با منیش تۆسقاڵێك هەناسەی ئازادی هەڵمژم
دەبینم ! لەم کونجی رەبەنی مەرگەوە، دەبینم
پیاوێکی چڵکن و ریش هاتوو ، نە کەسی بۆ ماوە !
نە خاکی بۆ ماوە :
((درەنگە وەختە ،
بریندارێکی بە کۆڵەوەیە، خوێناو چۆڕاوگەی لێوە بەستووە

ئەو شاخە تۆکمەی ئارامی دڵی
پەنجەرەیەکی شووشە شکاوە،
رەشەبای مردن لێی هەڵکردوە
درەنگە وەختە ،
خۆی فریشتەیە و مەرگی خۆشترە لەو مەینەتییە
دوودڵی و ویژدان ئارەقی شین و مۆریان پێ دەردا
یا دەمرێ و دەبن بە دوو مەیتی تر ،
لە مێژویەکی تۆمار نەکراودا
یا دەڕواو دەژین لە قوژبنێکی لە بیرکراودا )) .

١٩٨٩/٦ کییڤ

# لێرەش .. لەوێم

ئێوارەیەك بوو بای سارد هەڵیکرد
شەپۆلی هاری دەریای شێت و شوور ، جار لە گەڵ جارا
بە شاڵاو سەر و شان و ملی خۆی ،
دەدا بە سینگی نەرمی کەنارا
کچانیش پۆل پۆل دەگەڕانەوە
کەناریش بە بێ تریقەی کچان شانی لێ دادا
هەر قیژەی (چایکا ) و هاژەی  شەپۆل و وژە وژی با
سەریان کردبوە کوورەی بیرمەوە .
نە لە سەر دەریا دەشتی دڵەکەم تینوێتی دەشکێ
نە لە سەر سینەی کچۆڵەیەك دا گریانم دەنوێ !
دەریا شێتەکە ،
ئۆقرەم لێ بڕا، لە شەپۆلێکتا بمپێچەرەوە
هەر ئاوارەکەی دوای تروسکەکەم
ویستم بچمەوە گوندەکەی جاران
تووله ڕێیەکم نەدۆزییەوە  !

لەم دونیایەدا ،
هیچ دڵێك نیە ئەوەندەی دڵم وێران کرا بێ
مەگەر کوردستان
لەم دونیایەدا ،
هیچ دڵێك نییە ئەوەندەی دڵم تەلبەند درابێ
دیسان کوردستان .

٧/ ١٩٨٩
ئۆکراینا ـ ئاڵوشتە
سەر دەریای ڕەش

## پەردوو

بە وڵاتاندا دەگەڕێی
لەش لە شەمەندەفەرێکدا بێ
ئەندێشە چۆلەکەی سەر کەپرێکە رەشەبا هەڵیدەگرێ
لەش لە فرۆکەیەکدا بێ
ئەندێشە لەگەڵ پەڵە هەوری پایندا،
دەچێتەوە بۆ باوەشی دایکۆڵە خاك
بە  شاراندا دەگەڕێی
کۆشکی گەورە و بینای بە ئاسماندا هەڵچوو
دارستانی گەش و پاراو
پۆلە کچی مەستی تریقە و، کۆرپەی هێلانە ئارام
ئەمان لە کوێ و تۆی وڵاتی پەردوو لە کوێ
بێ بەراورد !
هوروژمی هاوار گەروو دەگرێ

مارف عومەر گوڵ

هەنگاو هەنگاو  دەچیتەوە سەر شاخ و هەردەکە
بە دیار دارستانی سووتاوەوە ،
تف لە کۆمپانیای بۆمبا دەکەی !

*        *        *

بە شاخ و دۆڵا مل دەنێی
بە هەردە و دەشتا  مل دەنێی
هەر دەبێ شەو پێ هەڵگری
تا دەچیتەوە زێدی خۆت
نە چڕنووك دڵی پێ دێتە دەر
نە ئەو تۆز و دوکەڵە چاوگەی چاوان جێ دەهێڵێ
نە ئەو ژانە دڕکاوییە سەر بەردەدا ،
ئەم مۆتەکەیە خەو نییە !
ئاگرێکە وەی لە حاڵم
لەوێ ئیتر  کوڵی گریان دەتچەمێنێتەوەو
نێوچەوان دەنێیتە سەر پەردوو  !

١٩٨٩/٨
کییڤ

# چەپڵەڕێزان

لە هەردەکەی ئەوبەر ئاواییە وێرانەکەوە ،
تەپ و تۆزێك دیار بوو
هێرش، هێرش نەبوو پان و بەرین
دیسانەوە ئۆردووە شوومەکەی تەتار بوو.
هەر لە چاو تروکانێکدا
دەغڵودانی کەوتووی بێکەس بووە چەڕە دووکەڵێك
بە ناوەندی ئاسمانەوە
هەر لە چاوتروکانێکدا
بە هەزاران ناڵە و هاوار بڵند بۆوە لە قووڵایی زیندانەوە .
پۆلە پێشمەرگەیەکی خەمناك
پۆلە پێشمەرگەیەکی بێباك
پۆلە پێشمەرگەیەکی دڵ پڕووزاو
لە دەرگای ماڵە بەردینەکەی خۆیانەوە ، گوێ قولاخ بوون
ئەوە کاری کردە نەبوو ، ئەوان مەفرەزەیەك و

هێرش، هێرش نەبوو  ئۆردوویەکی پان و بەرین ،
بێ ئامان بوو
ئیتر ئەو چەند دڵە پڕ لە پەژارەیە چڕنووکیان لێ ڕووا
پرچی ویژدانیان  دەڕنی
پرچی ویژدان ، چاوی گریان
وڵاتێکی سەرجەم وێران
با بڕوخێ ئەنجومەنی ئاشتی جیهان ..
چەپڵەڕێزان  !
*        *          *
ئەو برینەی لە کوردستان  لە دڵم بۆوە
نە کچی شەنگ ،
نە شەوی سەرمەستی  و ڕەنگاو ڕەنگ، بۆیان تیمار ناکرێ
ئەگەر هەتاوی  ئازادیم لێ هەڵنەیێ
ئەوا هەر خوێن بە دوامدا دەکشێ
سەر بە ڕەشەباوە دەنێم .. وا کوێراییم داهات
ئیتر ئەم بیابانی  لماوییەی تەمەن
هەژگێکی تێدا نیە بمپارێزێ
دارستانم  ، هەر لە خەونی لمستاندا سەوزە
وەی  وەی ،

دڕك گەمارۆی داوم ،
تف لە کورسی دەسەڵاتی گەورەی دونیا
حەسیرێکم پێ ڕەوا نابینن لە سەری بخەوم .
* * *
ئێوە بە هاری ڕەشتان دیوە ؟
ئەی پێنج هەزار درەختی قەرەبرووتی هەڵەبجە چی بوون
ئەی سێ هەزار کۆڵەوژی گەلی بازێ چی بوون ؟
بۆ تینوێتی چوونە سەر هەر چەم و ڕووبارێکی
ئەو کوردستانە
سڵ کەن ، ئاوەکەی ڕەوان نییە،
تەماشاکەن ،
لە سەرووی خۆتانەوە کۆمەڵە مەیتێکی تێ فڕێ دراوە
ئیتر وڵاتێکی ئاودامان ڕەشپۆش ، ئەوە هەر وڵاتی ئێمەیە !
ئەگەر کچۆڵەیەك دەرباز بووبێ
سەیری کراسە ڕەشەکەی بەری بکەن
ئەگەر داپیرەیەك دەرباز بووبێ
ئەوا هەناوی زووخاڵێکە لە کراسەکەی بەری ڕەشتر
ئەگەر باپیرەیەك دەرباز بووبێ
ئەوا ریشە پەمووەکەی،دەڵێی سەردەمی هەرزەکاریەتی

رەش رەشە !
ئاوەدانی  نەماوە !
ئەوا سەگ و پشیلەش کێوی بوونە
ئەوا مریشك و مەڕو بەرخ و کارە کۆرپەش کێوی بوونە !!
قەیدی چیە ؟
خۆ قەحپەخانەکانی بەغدا ئاوەدانن
خۆ کارگەی چەك و تەقەمەنی وڵاتانی دونیا  ئاوەدانن
بیکەنە چەپڵەڕێزان
بۆ ئەنجومەنی بەرزی ئاشتی جیهان !!

١٩٩٠/٢
کییڤ

## نازانم.. دەزانم

نازانم گۆرانیی بۆ کامە شەهیدم
بدەمە دەم سۆزی ئاوازی تارەوە
نازانم مەدالیای روخساری کام ئازیز
هەڵواسم بە ئەڵقەی ملوانکەی گەردنی یارەوە
کاروانێك ، دە کاروان ، سەد کاروان
قەڵایەك ، دە قەڵا، سەد قەڵا
چیایەك ، دە چیا، سەد چیا،
شەهیدم ریز بووە !
نازانم ناوی کام لوتکە شاخ
بنێم لە دیوانە هۆنراوەی ئاوارەم
نازانم ناوی کام چەمی خوێن

مارف عومەر گوڵ

بنێم لە بارانە فرمێسکی پەژارەم ؟
دەزانم پێش مردن ،
تف دەکەم لە نەخشەی سیاسەتی وڵاتان
دەزانم پێش مردن ،
دە پەنجەم دەبێتە نێزەی رق  بۆ چاوی دوژمنان .

٣/ ١٩٩٠
کییڤ

## بێ ئارامی

دوێ ئێوارێ ،
بەپشتی دەست دات بە شووشەبەندی دڵما
ئیتر زەڕنەقووتەی ئارام ،
لە شەققەی باڵی دا و فڕی
خۆزگە ئیمڕۆ کە یەکمان دی
بە هەردوو دەست ،
لە هێلانەی پرچەکەتا
باڵی بێ ئارامیم دەبڕی !

کییڤ
١٩٩٠/٣

## حەسرەت

نامەکەی تۆ ،
ئاگرێکی وای تێبەردام ،چی بکەم باڵم لێ ناڕوێ
بەشەو و ڕۆژ کچۆڵەکانی ئەم شارە سەوزەڵانە
سڵ لەگڕی هاواری بێ چارەم دەکەن !
چی بکەم سنوور ! لەگەڵ ئەوینی مرۆڤدا هەڵ ناکات،
دوو دوژمنی باوك کوشتەن !
لەوێ نەبووم !
کە هێلانەی هەوارەکەم لەدوو بەهارەی شیوەنی خۆیدا
گوێی بۆ سۆزی شەیدایانی دێرینەی خۆی هەڵخستبو
لەوێ نەبووم ،
خۆم بە بەژنی دوو بەهارەی هەواری وێرانەما بگرم

تا بزانم جەستەی کاممان زیاتر زەبری پێوەماوە ،
لەویٚ نەبووم ، بەڵام روحم.. روحی خواییم
دەروێشێکی سۆز گرتوو بوو لە دامێنی وێرانەوە
بەچنگ خۆڵی ،
وەردە کوێرەوە بووەکەی بەرماڵانی رادەمووسی
مەلی عەشقی ،
بەسەر وشکەڵانی دارتوو و
چناری شورە شێواودا دەنیشتەوە
ئەی داخ خ خ !
ئەو هەوارە هەمیشە بۆ نەیار دژە
لەبەر زوڵمی ڕەشەبادا،
قوربانێکی جۆگەلە خوێن هەڵبەستراوە
لەدونیایەکی بیٚ سنوور دا
دەریایەکی شەپۆلی رق مۆڵ دراوە .
ئەی داخ، ئەی داخخ
دووریی بە دەردێکی بردووم
بەشەو و رۆژ هەرگۆرانی بۆخۆم دەڵێم

مارف عومەر گوڵ

دڵ هێلانەی گڕگرتووە ،
زەڕنەقووتەی خۆشەویستیی تیا دەسووتێ
چاو کانیلەی پاش کۆچەکەی ئەمجارەیە
چاوەڕوانیی وایلێکردووم ، هەر بەڕێی پۆستەخانەوەم
ڕۆژی دوو جار پۆستەچی دێ ،
من چوار کەڕەت سندوقەکەم دەکەمەوە
هەر کەڕەتەی ، دووجار دووجار سەیری دەکەم !

١٩٩٠/٥
کییڤ

# ژەهرباران.. مەرگباران

ئاسکێکی زامداری هەورامان ،پێدەشتی بەجێهێشت
لە لوتکەی سوتاوی وڵاتی پەردوودا ،
تا ئەژنۆی نیشتبووە ژیلەمۆ
دەیڕوانی ، هەر گورگ بوو چواردەوری
هەر تەم بوو ئاسمانی بەرینی سەرسەری
هەر لەوێ ، لەو جێیە، بو بەدار
درەختێ ، بێ گەڵا.. بێ باڵدار
شوانێکی بەهاری بادینان ، بەچاوی کوێرەوە
مێگەلی چاو نووستوی،
ژێر هەوری ژەهراویی بەجێ هێشت
تێ ڕاما ! بەردەمی وا چیای جەستەیە
هەستی کرد ! چوار دەوری هەر گورگ و جەردەیە
بە تەکان ، دوای هەزار سەرسمدان
بە تەکان ، دوای هەزار هەڵپلان

هەمدیسان گەیشتەوە تەلبەندی دوژمنان !
دەسەیرکەن:
دارستان واکێڵگەی جەستەیە، نووستووە
دەسەیرکەن:
هەوراز و نشێوی ئەو خاکە،
پاڵ بەرد و توولەڕێی هەر خوێنە وشك بووە
هەوایەك هەڵناکا کە تاپۆی مردنی پێ نەبێ
لەبەینی شاخێك و دەشتێکا
سنوورێك نابینم جێ قەمەی زۆرداری لێ نەبێ .

کییڤ
١٩٩٠/٨

## سەرابی ئاخ

لەوێ لە سووچی دیواری ماڵ و دیوەخانەوە
لەگشت لای دێ - وە
لە ڕێ - و  لاڕێ- وە، دەمەو ئێواران
پۆلە سەرنجی باڵندەی حەز و هەناسەی خۆزگە
تیشکی نیگابون
 بۆ رووی کچانی گۆشەی سەراوان .
دەمەو بەهار بوو ،
چاو بۆ دیمەنی سەیران دەبزووت
خوێن لە لەش زابوو ،
دڵ بە گوڵاڵەی دەشت و دەر خۆش بوو
خەیاڵ کەوتبۆ مەلەی سەر پشتی کەروێشکەی گوڵشەن

ئاگا، بێ ئاگا
بەجوانیی سروشت مەست و بێ هۆش بوو .
بەڵام ئاخ داخێ ! ئازادی تەرمە
ژێری مین ڕێژە ، سنوری تەلبەند
ئاسمانی ژەهر ، دەوری قەمەیە
لەدایك نەبووین،
بۆ زوڵمی نەیار ، کۆتی گەمارۆ
لەدایك نەبووین،
بۆ چەشی دەردی ئا ئەم گەمەیە !

کییف
١٩٩٠/١٢

# لە چاوەڕوانیدا

هەر من نیم لە وێستگەی شەمەنەفەردا
جانتایەکم بە کۆڵەوەیە و بلیتم دەستناکەوێ
میللەتەکەم بلیتی شارستانیەتی لێ زەوتکراوە !
چی دەبێ ! با ئیمشەو سەر بە دیوارێکەوە بنێم !
ئەو کچۆڵە قژ خەنەییەی تەنیشتمەوە ،
هەر دەڵێی پەلك شۆڕی ناو حەیرانی دەشتی هەولێرە
تریقەی ئەوەندە بە گوێم ئاشنایە، روحم دەگوشێ .
ئەی کەنیشکە دونیا سەوزەی بێ ئاگا لە،
جیهانە سووتاوەکەی گەلم
درەختێکی ژەهر پێدا رژاوم ،
رەشەبا هەڵیگرتووم
قۆڵ بە کەمەرما بکە، با ئیتر گەردەلوول نەمبات
شەو بە رووی سبەینێدا شکاو
شەمەنەفەر لە چریکەی دا ...

١٩٩١/١
کییڤ

## مەشخەڵ

تاریکستانێکی بێ سەر و سنووره
رێ بە دێیی بۆ کەس ناکرێ
وەیشوومێکی سەر بە مەرگە ،
گوزەرانی ئەم قاقڕی سەدەی ژەهره .
چنگ  بە پرچی خۆمدا دەکەم
بە ئاگری ناخی ناخم  ،
سەرم دەبێتە مەشخەڵێك  .

٨ / ١٩٩١
کییڤ

## ڕەوە ئاسک

بە ئەستێرە دەڵێم :
دوێ ئێوارێ، ڕەوە ئاسکێك، لە خۆرئاوابوونا
بەرەو کەپری  سروشت کردەی دەم چیا چوون
ئەو بنارە، کانی و گوڵاڵەشی لێ بوو
لە تریفەی مانگ دەپرسم  :
تۆ شارەزای ئەمسەر و ئەو سەری ڕێبواران و ،
ڕێگە و بانی کوێرەوەبووی ،
هەواڵێکم پێ گەیەنە  .
لە تیشکی هەتاو دەپرسم  :
تۆ هەمیشە،

به سەر لوتکەی داربەڕوو سووتاوو،
پێدەشتی هەڵاڵە گڕگرتووەوە
سەوداسەرێکی .. ئەم سەودا سەرە ئارام کە .
هەر دەڕوانم ، لە دوورەوە ئاسمان نیشتۆتە سەر زەوی !
بڵێی چوبێتە سەر ئەو هێڵی تەلیسمە،
بە خاکی نوغرۆدا رۆچووبن ،
یا بووبێتن بە ئەستێرە لەو شینایی ساماڵەدا ؟!
نازانم لە بڵێسەی سووتانی دارستانا،
یا لە پرسەی مەرگی نەوبەهاردا
نازانم لە تێکئاڵانی دووکەڵی لوتکەو بناردا
نازانم لە کوێدا گەمارۆن !
شوێن پێی ئەسپێکم هەڵگرت ،
بە دەوری زەویدا سووڕامەوە
هەر گەیشتمەوە کوردستان
بنار هەر بنارەکەی جاران
تەمەن هەر پەژارەکەی جاران ..

مارف عومەر گوڵ

ئیتر ئەو ئێوارەیەم لێ بووە تەلیسمێکی دوکەڵاویی
ڕەوە ئاسك دەرنەکەوتنەوە
لەوساوە دڵ، هەزار بە هەزارێکی زریان گرتووە
منیش پۆڕێکی لانەوازی سەر بەفرم ،
پێدەشتم لێ چەکرێژ کراوە .

١٩٩١/ ٩
کییف

## برین

وێڵی گوڵ بووم، بۆ پێشوازیت ،
بە چاو ئەستێرەم کۆکردەوە، بیدەی لە پرچ .
چاو لە رێگا بووم، نەهاتی ،
ناترسی رێگەم لێ تێك چێ ؟!
دوژمن نەیتوانی بمکوژێ :
تۆ بریندارم مەکە !

١١ / ١٩٩١
کییڤ

## هەواڵ

لەو گرم و هەرای :
تەرزە بارانی مەرگ پژێنی سەر ڕەنجی لەمێژینەی کوردەوە :
چەخماخەی هەواڵێك زەوی و ئاسمانی لە یەك دا و ،
دای بە کەژی ورەی بەرزو ئاواتمدا ،
ئیتر دوو چاوگەی فرمێسکی لێ هەڵقوڵین
لەو ساوە ، سەبووریم تك تك رژایە بەر پێ ،
ئیتر لەو رەوی لوتکە و بنارەدا ،
ریشە بژەکەی ( حەمە رەش )
بە دەوری ئەستێرەی گەلاوێژی دەگمەندا ، خەرمانەی دا .
ئەگەر نیگارکێش بوومایە:
نەخشەی ئەوم دەکێشا، لە ئان و ساتی بوومەلەرزەدا ،

به چیادا سەردەكەوت
ئەگەر گەردوونەوان بوومایە:
پۆستەری ئەوم دەكرد بە گەردنی هەموو ئەستێرەیەكەوە
ئەگەر شاعیرێكی بەبەهرەش بوومایە:
دوا دیوانی خۆمم دەكرد ، بە میلۆدیای خوێنی ئەو و
بە جیهاندا جاڕم دەدا .

١١ /١٩٩١كییڤ

## کێویی

مێژووم، خوێنێکە چاوی گرتووم
ئیمڕۆکە زیخ بارانێکە،
جەستەی کردوومەتە تارایەکی ئاڵ ئاڵ
سەرمابردەڵەی کردم ئەم لەش کوتانە ،
بۆ نیشتمانەکەی دایەگەورە سوێم بۆتەوە !
ئاگردانەکەی جاران، لە ژێر پەردوودا  ون بووە
دارستانەکەی جاران، هەر پرچ دەڕنێ بە سەر وێرانەوە !
لە دوور وڵاتیدا، لە بێ وڵاتیدا
بە ڕۆژ ئەندێشەیەکی کپ، دەستبەسەرم دەکات
بە شەو تاك و تەنیا، لەگەڵ ئازیزاندا گفتوگۆمە
ئەگەر خەو بینین نەبوایە ئێستا کێویی ببوم  !

١٩٩٢/ ١
کییڤ

# دوای ڕەو لەلای من نیشتەجێن

هێشتا تاریك و لێڵی بەربەیانە،
ژوورێکی پڕ شەونمی گریانە خاکی من
سەرم دەوەنێکی پیرە ساڵە،
هەزاران باڵندەی لانە وێران،
کردوویانە بە هێلانە،
تەمەن بە پێوەی ڕاگرتووم .
گۆلاوێکی بەرگیراوە وڵاتەکەم !
ماسیگران بە دیارییەوە نامورادن ،
هەر بە تەنیا درەختی ژەهرگرتوو دەیلاوێنێ .
درەخت ئەو کاتە دڵگیرە دەست نەگاتە چڵە پۆپەی
هەموو مەیلێکم دامرکا ، تەنیا ئارەزووی خۆبەخۆییم
دەمسوتێنێ،
نمە بارانێك بە سەر ئەو کڵپەیەمدا داناکات !

مارف عومەر گوڵ

هەر بە فرمێسکی خۆم ماوم،
ڕەوی مرۆڤە، ڕەوی ئاژەڵ، ڕەوی کۆتر،
ڕەوی باڵندە، ڕەوی هەموو شتێك .
دایك لە بەفرا دەنێژین،
کۆرپەی بەستوو دەکەینە کێلەکەی .
ڕەوی مردووشە ..
ئەو ڕەوە بە زیندو و مردووەوە ،
بە کۆڵە پشت و قاپ و قاچاغەوە ،
بەقریشکە و پێکەنینەوە
ئەو ڕەوە بە دەستی بەتاڵ و هەناسەی ساردەوە ،
ئەو ڕەوە بەلاوك و شینەوە
ئەو ڕەوی پێخاوسی سەر بەفرە ،
شاشەی زەمانێکە سات بە ساتی مێژوویەکی جەنجاڵە !
نازانم !
نە هەناسە بڕ دەکات لەم ڕێگە دوورە ،
نەهێزی ئەژنۆ.
نابڕێتەوە،
گرێکوێرەی ئازارێکە نە لە مەرگ دەچێ ،
نە لە ساتی لە دایك بوون ،

ڕوح بە دەم ڕەشەباوە لە پێچی گەردەلوولێکدایە ،
دەیداتە دەم پێچێکی تر ...
ڕۆژگارێکی بە گۆبەندە ،
جەرگی یەکدیمان هەڵکۆڵی ...
هەموو ئاقارێکمان گۆڕستانی بێ گڵگۆیە ،
فریای کێلە بەردینەش ناکەوین
شار ئاوەدانییەکی بە ژاوە ژاوە ،
سەگوەڕی ئەنجومەنی وەزیران دێ بەربوونەتە کەوڵی زەوی !
پایزێکی دەردەدارە ،
باوەش بە درەختێکا دەکەم، گەڵا دەمدوێنێ ،
چۆڕاوگەی خوێنێك بە سەرمدا دەڕژێ ،
باخی گوڵاڵەسوورەیە دارستانی قژ هەڵوەریو ،
چیمەنێکی تێر خوێنە دەشت و دەر ،
تەلیسمێکی نوشتاوەیە زاری قسە
شووشەبەندێکی درز بردووە ئەو دڵەم ،
ئەگەر و نەگەر هەناسە سواریان کردووم
شەو بێداریی چەپۆکانی هەژدیهایەکە ،
لە ترسی منداڵانەی سامی گۆڕستان دەچێ
مانگە شەوێکی خەمناکە ،

هێشتا بە سەر هەرزاڵەی خەونەوە ،
وەنەوز دەمگرێ
کوللە لە بەروبوومی رەنجی داوم !
ڕەنج بێوەرێکم کەوتومەتە داوی ژیانەوە
ڕشەبایەکی چەتوون لوولی داوم سەر دەنێمە سەر ئەژنۆ و،
ڕاست دەبمەوە
چاوم کزەچرای ژێر ڕەشماڵی ماڵە ئاوارەیەکە
پەروانەی خۆشەویستی دەورەی داوە
تەدارەکی بووکی ئازادیی تەواو نابێت ،
هەر تێهەڵچوون و چاوەڕوانییە تەمەن !
بە دیار زڕەخەونی شیرینمەوە ،
ئێشکچییەکی دێرینەم ،
پیربووم و هەرزەکاریشم
هەر وەنەوز گرتمی :
ڕووت و عوریان لە بەر کوانوویەکی پڕ پشکۆدا و
لە گەڵ بووکی ئازادیدا ، تریقە و ماچ و مووچمانە .
ئیتر گەواڵەیەك دەمشواتەوە !
ئەوساکە دیلێکی دەست و پێ پێوەند کراوبووم ،
ئەوەندە ئازادیم هەبوو بڵێم:

بەڕەڵڵام کەن .
ئێستا ڕەهایەکی دەست بە سەرم ،
گوێ لە شکاتنامەم ناگرن ،
تووڕەبوونێك لەم ئاشی زەمانە گرتوومێتی ،
ئەسپێکی سەر شێتە و جڵەو ناکرێ .
کە دایکم مرد !
نیشتمان ئاوەدانییەکی پۆشتەو پەرداخ ،
نە هەوری ژەهراویی هەبوو ،
نە دووکەڵی مەرگباران .
مەلۆتکە بووم ،
بە ڕووی گوڵەخوریی زەرد و سوور و زەنگیانەی
سەر لانکەمەوە پێدەکەنیم
ئەوا تەمەنێکی ئەنگوستەچاوە ،
ئەو هەموو زامی ئاڵ ئاڵە
پشکۆی بەفرستانێکی نەهاتن
بە ڕووی تارمایی مەرگەوە ،
ڕۆشنایی هەردوو گلێنەی بەفر بردوون ،
دەوروبەر هەراسانێکە ،
ناوچەوان کەوتۆتە بەر تیغی سەرمایەکی ڕچیو .

# نیشتمانم

دارستانی دەم ڕوبار بوو

مارف عومەر گوڵ

95



چەترەکەیان زەوت کردم !
تەرزە دایکوتام ،
ئەم ڕێچکەیەش دەچێتەوە سەر هەڵدێر
هێشوویەکی هەڵوەریوە ئەو کۆرپەی ئۆمێدی منە ،
بە سەر درەختی جەستەما شۆڕ بۆتەوە .
دەست بە چاوتانەوە مەگرن ،
تیشکی چاومە تروسکایی سەر هەواری چرا دزراو ...
وێڵێکی بە هەڵپە ،
ڕۆژ تا ئێوارێ هەرزە گەردێکم ،
هەندێ جار دیمەنێکی لێڵە سەرنجم
گەلی ڕەوکردوو لەو هەڵچوون و داچوونی لوتکە و بنارەدا ،
لە گریانێکما نیشتەجێ دەبێ .
خواستم ،
هێلانەی زەڕنەقووتەی ئاواتێکە ،
لە تاریك و ڕوونی بەرەبەیانی مرۆڤەوە هەر باڵە فڕێیەتی
دەستم ،
کەپری سەر کێڵگەی ڕەنجێکە ،
توێشووی ڕۆژی وەیشوومەیە ،
هەناوم ڕەش داگەڕا ،

به دوای کارێزی کوێرەوە بوودا وێڵ بوومە
هێشتا سەر گەرمێکی دانەکەساوم ،
هەر خۆزگەو هارە هارمە ...
بە ئاگری دەروونەوە لە روباری خوێنینم دا ،
جەستەشم گڕی گرت ،
ئیتر خوێن سووتان تەنییەوە !
دەوروبەر سامدارتر بوو ،
بۆنی خوێن دێ ، هەر دەسووتێ ...
بۆنی خوێن دێ ، بۆنی خوێن
مرۆڤ دەسووتێ ، شاخ دەسووتێ
ئاژەڵ دەسووتێ ،
پەلەوەر دەسووتێ ،
باخ دەسووتێ
هەموو شتێ دەسووتێ ...
دوژمنان حەپەساون ،
ئەم میللەتە تەواو نابێ !

ئۆکراین – کییڤ
١١/١٩٩١- ٣/١٩٩٢

# ترس

که دایکم مرد، مەلۆتکە بووم
داپیرەم مرد، لەماڵ نەبووم
باپیرەم مرد، لە ماڵ نەبووم
باوکیشم مرد،لە ماڵ نەبووم
ترسم هەیە خۆیشم بمرم ،
لە ماڵ نەبم !

١٩٩٢/ ٤
کییڤ

## لە زمانی باوکمەوە

لە سەردەمێکا نامەرد
دەستڕۆ و بە دەسەڵاتە
هەوارگەیان شێواندم ،
تەمەن وەك مەرگە ساتە .
کە سەربەرزانە ژیام
با هەر مەرگم خەڵات بێ
سەربەرزی بۆ نەوەکەم
ئازادی پڕ وڵات بێ .

١٩٩٢/ ٤
کییڤ

# میلۆدیای چەمێکی خوڕ

**بۆ باوکم**

شەوی هاوینێکی بێ ملۆزم
ئەستێرەی گەش بە روومەوە پێدەکەنی
هۆرەی چەم بوو ئەو دڵە دەروێشەی دەگریاندم
 بڕوا ناکەم لێم ون بووبی!
ئێستا ئەگەر بێمەوە سەر پەردووش  تۆ لەوێ نیت
ئەکەر بێمەوە سەر چەمیش تۆ لەوێ نیت
نازانم ((سۆز))ەکەی جاران هەر ماوە
یا لە گەڕانەوەمدا لەگەڵ  ((باسەڕە)) دا تێ هەڵدەکەین
خۆ من غەریبیی سووتاندمی ،
ناتوانم بە سنووری پاسەوانی
«بەد ڕەفتارو  بەد کردار» دا بێمەوە  .

١٠ /١٩٩٢
بەلژیك ـ لیوڤن

## ئومێد

درەختێکی هەمیشە هەڵنەکەنراوم
درەختێکی نهێنی پێ نەزانراوم
کە هێرشی بەفرم بۆ دێ
لق و پۆپم دادەشکێنێ
بەڵام پشتم لە نێو خاکدا ڕەگاژۆیە
ساڵانی سەختی زریانیش نامفەوتێنێ .
*          *          *
ئەو درەختەم ، سروشتم لێ بووە جادوو
ئەو درەختەم ، لە تەنیایی خۆیشم ماندوو
کەی بێ هەورێ بملاوێنێ
دەشتی ڕووتەن، ئاوەدان بێ

باڵندەی دۆستی ئەوینم بێتەوە لام
گەڵای بەرم جوانییەکی ئاوەدامان بێ .

*          *          *

درەختێکم ، پەردووی وێرانەم جێ نەهێشت
درەختێکم ، ژەهری بێ کەسییان پێم چێشت
هێشتا گەڵای هەڵوەریوم
بای زەمانە رایدەماڵێ
هێشتا شکۆی سەربڵندیم بە ئومێدە
گوڵاڵەی وەرزێکی تازەی لێ بئاڵێ .

١٩٩٢/١٢
بەلژیك - لیوڤن

# چەپگە گوڵ

له تەم و مژی ڕێی بۆ هەواردا سەوڵی ئەندێشه ،
دەمداته دەستی شەپۆلی شێتی ژینێکی بۆ پەی
هەرچی هیوایەك له هۆشمدایه
شکارته دەغڵی بۆ دروێنەیە،
ڕەشەبای ڕۆژگار خستویێتییه سەما
ئەوە چاو نییە، لەبەر تەوێڵما
جووتێ کانیلەی بەرد باران کراو ، کیژ لێبڕاون
ئەوە خوێن نییه وا له جەستەما
شەرابێکه ئاڵ ، ژانی هارییه وا له کەللەما
شێت و بەرە ڵڵا ، سەرگەردانی یەکەم بۆ وڵاتییه
بەفر و بارانه هاوڕێی شیرینم

مارف عومەر گوڵ

عومری درێژیش ، زەردەپەڕێکە ،
لەو دیو ئاسۆوە هیچ دیار نییە .
چۆك لە سەر ئەژنۆ تەماشای دوورکە ، مەودا بێ بنە
ها چەپکەگوڵێ ، بۆ کۆڕی شادی
توخوا مەڕوانە ئەو دڵە سەگەم ، لە خوێنا وونە .

٢ /١٩٩٣
بەلژیك / لیوڤن

## نامە

نامەی تۆ هاتن ،
زانییان هێشتا دەمەوبەیانە و من ڕاکشاوم
نەیان ویست  جارێ بۆ ئارامم کەن ،
دەستم ڕاکێشا ،
چەپکێ تریفە هاتە بەرچاوم  .
نامەی تۆ هاتن ،
چاوم، زمانم
دڵم، ویژدانم
بوونە ئارامگەی خەندە و پێکەنین
شەپۆلی وشە بە سەرما باری
ئیتر ژوورەکەم پڕ بوو لە ئەوین  .
نامەی تۆ هاتن ،

مارف عومەر گوڵ

کۆرپەی هۆنراوە ، سەرلەنوێ، دیسان
لەگەڵ ئەو دڵە بێ ئۆقرەیەمدا
بۆ جارێکی تر کەوتەوە دووان
من و هۆنراوە ئەوا دەمێکە لە یەك تەریوین
ئیتر شەپۆلی دونیای ئاوازم
بۆ باوەشی تۆ  وا هەڵدەفڕێ
ئیتر تەنیایی بێ راز و نازم
هەر لە سەر دەستی تۆدا دەنوێ  .

بەلژیك ـ لییژ
١٩٩٦/١/ ٣٠

# عەشقی هەتاو

لە ئاسۆوە ، نازانم وا هەتاو هەڵدێ
یا پرچێکی خەنەییە،
چەپکە تیشکی بە سەر دارستاندا دەپژێ
بەیانیان زوو بە شەیدایی
روو لە ئاڵیی هەتاو دەکەم بە تەنیایی.

*          *          *

وا ڕوخسارت ئاوێتەی کازیوە بووە
ئاورێشمی پرچی تۆیە
دەمەو شەبەق دەوری هەتاوی گرتووە
لێم گەڕێن وا بە تینی چاو
کاسەی سەرم پڕ بووە لە عەشقی هەتاو .

٢٠ / ٣ /١٩٩٦
بەلژیك ـ لییژ

# هەوار

گوڵستانی رووح تەرزە دایکوتا ،
پووش و پەڵاشە سەوزەڵانی ژین
ئەستێرەم دەدوان بە نیوە شەوێ
خۆم نەگریام و ئەو کەوتە گرین .

*　　*　　*

خۆرەتاوی دەم کەلی سبەینێی ،
بەفر گرتوو بو هێنامییە شنە
پیاهەڵپژانی ژیان و مەرگە ،
خونچەی ئاواتی لە بەیندا ونە .

*　　*　　*

تەمەن شەپۆلە راماندەماڵێ
نەکەن دارستان ئاگر باران کەن
چاوی هیوامان ئەوا دارژا
نەتانکردبێ هەوار وێران کەن .

لیێژ / ١٩٩٦

## ئاوات

له بێشەڵانی تەمەندا
بە لق و پۆپی شەیدایی
له بن ئەشکەوت و دەوەندا
کەپرێك دەکەم بۆ تەنیایی .

*　　*　　*

تیشکی هیوا له ئاسۆدا
نوقمی تەم و مژێ بووه
دڵ ئاوریشمێکی ڕەنگینە
به نێو تەلبەندا ڕۆچووه .

*　　*　　*

له سۆراخی تروسکەدا
دیدەم ئاشنای خۆرەتاوە
له دەشتێکی زوقمەڵاندا
دڵ گڕێکی هەڵایساوە .

چارەنووس دۆستی نامۆیی
هەوری دووریی دامدەپۆشێ
بەڵام ئەستێرەی ئەوینێك
لە دوورەوە بۆم دەورشێ.

*        *        *

لە بەر گەڵاڕێزانێکدا
تیشکی هەتاو دەچنمەوە
هێشووی ئاواتێکی دێرین
لە نێو ڕەزدا دەڕنمەوە .

*        *        *

لە بێشەڵانی تەمەندا
بە لق و پۆپی شەیدایی
لە بن ئەشکەوت و دەوەندا
کەپرێك دەکەم بۆ تەنیایی .

بەلژیك ١٩٩٨

## لە کوێوە بێم

ئەم ڕێگایە
چەندین لوتکەی سەر بە تەمە
ئەم ڕێگایە
چەند هەورازی بە ئەستەمە
لە کوێوە بێم ؟
بێ وڵات و بێ جێگە و ڕێم !

*   *   *

چڵی خۆزگە گەورەترە
لە سنووری  نێوان هەنگاو
تیشکی هیوا  بەتینترە
لە ڕوناکیی پرشنگی چاو
لە کوێوە بێم
بێ وڵات و بێ جێگە و ڕێم
لە کوێوە بێم ؟!

*   *   *

ئەم ڕێگایە چەند سنووری بە تەلبەندە
ئەم ڕێگایە
بە ڕێگرو جەردە بەندە
لە کوێوە بێم
بێ وڵات و بێ جێگە و ڕێم
لە کوێوە بێم ؟!
ئەم ڕێگایە
پڕە لە دەریای بێ سنوور
ئەم ڕێگایە
نامباتە لای ئازیزی  دوور
لە کوێوە بێم
بێ  وڵات و  بێ جێگەو  ڕێم
لە کوێوە بێم ؟!

بەلژیك / لییژ ١٩٩٨

# ڕێژنە

جاران هەر تۆ بووی وەلای دڵمـەوە
زوڵفت میراو بـوو بە دیار گوڵمەوە
پێم وابوو دواجار لەم کاروانەدا
هاوسەفەرمەبیت لەم ڕێ و بانەدا.

* * *

تینی چاوانم ئەوا دارژا !
نمەی گریانم وەك باران پڕژا !
تەمەن شەپۆڵە دەست دەنە باڵم
ڕامان دەماڵێ هاوار بە ماڵم !

* * *

یەخەم بەرنادا مەینەتی ژیان
کەس لێم نەڕەنجا، بۆ تۆی لێم ڕەنجان
وشکەڵانێکە، کێڵگەی دەروونم
ڕێژنەی ئەوینە هەناسەی بوونم .

لیێژ / ١٩٩٨

# ئاگردان

لە پەنجەرەی ئەم دەروونە شەیدایەوە
گەردەلوولێك دێتە ژووری
جارێك بە رووی ئازارێکدا لەترم دەدات
جارێك بە رووی بەهارێکدا لەترم دەدات
بە ڕێیەکی نهێنیدا، گۆرانی خۆش
وەك گڤەی با و میلۆدی چەم
دەمباتەوە هەوارەکەی دڵنشینم
ئەی بڵێسەی گڕی تەمەن
لە جەنگەڵی بێ ئارامیدا هەڵبکە
ئەی چاوگەی ئەو ڕێگە بە تەلبەند چنراوەم
زاری وشکی دووریم تەڕ کە
لە رۆژانی هەڕەتی گەڵارێزاندا

هەرداوهەرد و چەماوچەم بوو
گەڵای زەردم کۆکردەوە
بۆ هێلانەی کۆرپەیەکی دوورە وڵات
لق وپۆپم کۆکردەوە
بۆ بڵێسەی ئاگردانی دڵێکی لات .

بەلژیك ١٩٩٨

# گەڕانەوە

من ناتوانم بچمەوە لای ،
کێڵگەی بەهاری شارەکەم
لەم دوورەوە
بەستە ئەڵێم ، بۆ گیانە پڕ ئازارەکەم .

چی بڵێم بە دارستان و
شاری رەنگینی چراخان؟
چی بڵێم بە دەنگ و سەدا و
نمەی فرمێسکی منالان ؟

خانەی ئەم دەروونە شێتە
هێندە بەرد باران کراوە
گەردەلوولێ رووی تێ بکا
پەنجەرەی پێوە نەماوە .

ئای دڵم چەند بەهاوارە
شایی و شینم پێوە دیارە
مەگەر ڕێژنە ،
دارستانی خەماویی ژین بشواتەوە
ئاخ وخۆزگەی گۆشەی دووریی
بۆ نیشتمان بباتەوە .

بەلژیك ١٩٩٨

## ڕێژنە، هەر ڕێژنە

تەمەن پشکۆیەکی ئاڵەو
ئەم زەمینە کوانوویەکی پڕ خۆڵەمێش
قەقنەسێکی لانەوازم
چاوم بۆتە پەڵە هەوری
پڕ گریانی جیهانی ئێش !

*        *        *

لەبوونمەوە،
هەنگاو هەنگاو زوو کەوتمەرێ
بەرەو دونیای دارستانی هەمیشە بەهاری تەمەن
پایز گەڵام دەکردە کراسی بەرم
لق و پۆپی داوەریوی بەر ڕەشەبام
بۆ شەوانی باوبۆرانی نەهامەتیی کۆکردەوە
بەسەر شەختەی زستانا من ،

هەر دوو دەستم بە درەختی بڕواوە گرت.
پەڕیمەوە،
بەسەر ترسی کەندەڵانی داتەپیوی ڕێگەوبانا ، پەڕیمەوە
بەسەر چەمی خوڕی دامێن چیای سەختی بەفرستانا،
پەڕیمەوە
بەبێ چەتر لەبەر تەرزەی لەناکاوی ئێوارانا ،
تەکان تەکان بەرێوەبووم
بۆ تۆزێ خەو ، لەبەر کزەی کشاوی سەر شەختەبەندا
وچان وچان بەپێوەبووم !
لەناخمدا ، تێرو تەسەل .. بەهەشتێکی بەرین بوو دڵ
لەناخمدا ، زەحمەت کارێکی ئاسان بوو.
کە دەمڕوانی، دەوروبەرم بە مروەت و چاکەخوازبوون
مەینەت بەرچاوی نەگرتم ،
ئومێد چرایەکی گەشبوو بەدەستمەوە !
دەستی رق و کینەو شەڕ هات !!
بەنێوانی دڵی گەشی هەردوکماندا دزەی کردو ،
هێشتا یەکەم ساڵەی جەژنی لەدایك بوونی ڕێژنە بوو
ئەتمۆسفێری خەمیش تەمی بە بنمیچی ،

ماڵی رووت و هەژارمدا راکێشابوو ..
جارێکی تر من مۆمێکم دانەگیرسان
لەجەژنی لەدایکبووندا ،
ئیتر رێژنەی خۆشەویستیی  بەکەلێنی ناکۆکیدا
کەوتەخوارێ،
کەوتەخوارێو بەداوێنی ژیانەوە گیرسایەوە
ئیتر دڵم بەسەر جەستەی گڕ گرتوومدا
بۆ هەمیشە گریایەوە !

بەلژیك  ١٩٩٩/٩/٢٠

- شیعری مارف عومەر گوڵ داکۆکیکردنە لە چەمکی شوناس، ئەو هەر لەسەرەتایەوە ئەم ڕێچکەیەی گرتووە...
- مارف عومەر گوڵ لەو دەنگە کەمانەی هاونەوەی خۆیەتی کە زۆر گەشبینانە لە شوناس و دەوربەری خۆی دەڕوانێ.
- هەڵبژاردنی شێوازی شیعری نوێی کێشدار، کە تا ئەمڕۆیش بەیەکجاری وازی لێ نەهێناوە، جگە لە هەندێك شیعری نەبن کە تێیاندا دەسبەرداری کێش بووە، بە پێچەوانەی شاعیرانی نەوەکەیەوە کە هەموویان ڕوویان لە شیعری بێکێش کردووە.
- نیشتیمان وەك بەشێك یا زاراوەیەکی نێو شوناس ئەمسەر و ئەوسەری شیعری د. مارفی داگیرکردووە، ئەو لە هەموویاندا لەیەك ژێ ئەدات، بەڵام بە ئەنجامێکی جۆراوجۆرەوە.

عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی

honrawe

# Nîştmanm darstanî dem rubar bû

## marif omer gul

Slêmanî - 2016